ده‌زگای ڕۆشنبیریی شه‌فه‌ق - كه‌ركووك
بۆ ته‌مه‌نی ٩ تا ١٤ ساڵ
تشرینی دووه‌م ٢٠١١
١٧

# حاجیله



گوڵی حاجیـله‌كانی ده‌شــتی هامــوون
نه‌كه‌ی بیده‌ی به‌ نێرگیز جاڕی گه‌ردوون

كیسه‌ڵێک له‌ ده‌ریای سووره‌وه‌ گه‌یشتووه‌ته‌ نێوان رووپه‌ره‌كانی ئه‌م گۆواره‌دا و پشووی داوه‌ ، تۆی ئازا ئه‌گه‌ر دۆزیته‌وه‌ ، ئێمه‌ خه‌ڵاتێک ده‌كه‌ین .



# گوڵزاری حاجیلە



## ژاڵە

زەینەب حەسەن - تەقتەق

ژاڵـە ڕووەکێکـی ژەهراوییـە و نیشـتمانەکەی لە دەوروبەری دەریای سپییەوە تا چین درێژەی هەیە. ڕووەکەکە بریتییە لە دەوەنێک کە بەرزییەکەی دەگاتە زیاتر لـە دوو مەتر و نیو. گەڵاکانی سـادەن و هەر سـێ گەڵایەک بە دەوری گرێیەکی سـەر لقەکەوەن و، ڕەنگیان سەوزێکی تۆخە. گولەکەشی سپی یان پەمبەیی یان سوورە. لەبەر هەتاو و شوێنی نیوەسێبەر دەڕوێ و حـەزی لـە ئاودانـی زۆر نییە و پەینی پێویستە.



## دارچین

سەمیرە عەلی - خورماتوو

ئـەو دارچینـەی کە وەک بەهـارات بەکار دێ، بریتییە لە توێکڵی دارێکی هەردەم سـەوزی ناوچە گەرمییەکان، بەرزییەکەی لە نێوان ١٠ تا ٤٠ مەتر دەبێ.
نیشتمانی دارچین وڵاتی سریلانکایە و لە ناوچەکانی تری باشـووری خۆرهەڵاتی ئاسیا و لە باشووری ئەمەریکا و هیندسـتانی خۆرئـاوا دەڕوێ. گوڵێکی زەردی هەیە و بەرەکەی بچکۆلانەیە و شێوەی لە مێخەک دەکا.
دارچین بۆ چەندان مەبەسـتی پزیشـکی بەکار دێ. بـۆ نموونـە: ڕێگرتـن لە ڕشـانەوە و کەمکردنـەوەی ئازاری ماسـوولکەکان و کەمکردنەوەی ڕێژەی شـەکر لە خوێندا.

## سۆسن

ئەحمەد سەعید - کۆیە



گوڵی سۆسن ڕووەکێکە بە پیاز زیاد دەکا و تەمەنی درێژە، گوڵەکانی وەک پەلکەزێڕینە ڕەنگاوڕەنگن، مۆر و سپین، بۆنێکی هێمنی هەیە. ئەم گوڵە دوای لێکردنەوە ماوەیەکی زۆر دەمێنێتەوە بۆیە دەشێ بخرێتە ناو چەپکە گوڵ و بە دیاری پێشکەش بکرێ.
سۆسـن حەزی لە بەرهەتاوە و لە تەنکە سـێبەریش دەڕوێ. دوو هەفتە جارێک پێویستی بە پەیینە و، تەنیا لە سەرەتای چاندنی پێویستی بە ئاودانی زۆر هەیە.

## شووتی



عەلی حەمەرەشید بەرزنجی - سلێمانی

مـــن خڕ و درێژکۆلەم
گـــەورە یاخود بچکۆلەم
کە پێ دەگـــەم شیرینم
مـــیوەی وەرزی هاوینم
دەمـــپارێزێ توێکـــڵەکەم
تا بە جوانی پێ دەگـــەم
توێکڵی سەوز و ناوی سوور
دەمناسیتەوە لـــــە دوور
پاکم دەکەن بە چـــەقۆ
قاشم دەکەن لەسەر خـــۆ
لەسەر قاپ لە ناو سینی
زۆر جـــوانم کە دەمبینی
ئەوســـا دەورم لێ دەدەن
دەمخـــۆن و تامم دەکەن
ئێســـتا دەزانن من چیم
هـا هـا هـا هـا من شوتیم

## هاوکاری گیانلەبەران

ئەسعەدی لوڕ زادە - چەمچەماڵ

مام بۆق نەخۆش کەوتبوو
خۆی لێ درێژ کردبوو
کیسەڵێک خۆی پێگەیان
گوتی چیە هاورێ گیان؟!
دیارە کە وا نەخۆشی
قیرەت نایە و بێ هۆشی
بۆقەی خستە سەر پشتی
بە پەلە نەک بە سستی
هێندەی بڵێی یەک و دوو
بۆ ماڵی مام قرژانگ چوو
ئەویش خێرا دەست و برد
بە یەک دەرزی چارەی کرد
پێمەکەنن منداڵان
ئەوانیش وەک ئێمە وان
کاتێک نەخۆش دەکەون
بۆ لای پزیشک دەچن



## مەتەڵ

عوسمان دەروێش شکور - کەرکووک

نۆ پیتە ناوی گیاندارە
سپی وەک بەرخ ڕەشە وەک کارە
لەناو ماڵ و بەرهەیوانە
دروستی دەکا هێلانە
مەلێکە دێ لە بەهارە
پایز کۆچ دەکا دووبارە
پیتی پێنج و شەشی وردی
ژمارەیەکە بەکوردی
پیتی هەشت و نۆ لەگەل سێ
یەکێکە کە هیچ نەبیستێ
پیتی سێ و شەش بنووسە تۆ
بەسەر ئەو جێیەدا برۆ
ناوی مەتەڵمان کام مەلە
دە هەڵیبێنە بەپەلە

## فەرهەنگی حاجیلە

بێلان - کەرکووک

بایت bite

گاز، گازگرتن لە شتێک مانای ئەوەیە کە بە ددانەکانت هەوڵ بدەی ئەو شتە ببڕی.

بلێید blade

بەو بەشەی چەقۆ یان شمشێر دەگوترێ کە پان و تیژە و بۆ بڕین بەکار دێ.

بلەیم blame

گلەیی، ئەگەر وا بزانی کەسێک کارێکی خراپی کردووە، ئەوە گلەییی لێ دەکەی لەسەر ئەو کارە خراپە.

بلانکت blanket

بەتانی، ئەو پارچە ئەستوورەیە کە بەسەر پێخەفدا دەدرێ و بۆ خۆگەرمکردنەوە خۆمانی پێ دادەپۆشین.

بلاینd blind

- بەواتەی کوێر دێ کە ئەو کەسەی نابینێ و لە هەستی بینین بێبەشە.

- بەو پۆشاکەش دەگوترێ کە بەسەر پەنجەرەدا دەدرێ بۆ ئەوەی داپۆشرێ (پەردە نییە).

بلۆک block

- بلۆک بە پارچەیەکی ئەستوور و ڕەقی دار یان بەرد دەگوترێ، وەک ئەو بلۆکە چیمەنتۆیانەی بۆ دروستکردنی دیوار بەکاری دێنین.

- هەروەها بە گیرانیش دەگوترێ، بۆ نموونە کاتێ ڕێڕەوێک دەگیرێ و هیچ شتێک ناتوانێ بە ناویا تێپەڕێ.

## ناوی کوڕانەی نوێ

شارا ئەحمەد - داقووق

پۆلو - سکڵ

تامان - چەپەر

دارڤان - داربڕ

دڵشا - دڵخۆش

دڵشێر - ئازا

رامیار - شوانی پەز

ستران - گۆرانی

شاباز - بازی سپی

شا - پادشا

مەلوول - خەمبار

## پایتەختی وڵاتان

شلێر محێدین - قەڵادزێ

| | |
|---|---|
| بانکۆک | تایلەند |
| برۆکسل | بەلجیکا |
| مانێلا | فلیپین |
| نایرۆبی | کینیا |
| نیامی | نێجیریا |
| هلسینکی | فنلاندە |
| هاڤانا | کووبا |
| لیما | پیرۆ |
| لاپاز | پۆلیڤیا |
| گیتۆ | ئیکوادۆر |

## ئەپۆکرات

زیاد ئەحمەد - هەولێر



ئەپۆکرات باوکی پزیشک ساڵی ٤٦٠ی پێش زاین لە دوورگەی کوس لەدایک بووە و ٩٥ ساڵ ژیاوە. و مەزنترین پزیشکی سەردەمی خۆیەتی، کە توانیی کاریگەریی بیرۆکە کۆن و دواکەوتووەکان لەسەر زانستی پزیشکی لابەرێ، هەروەها خاوەنی بیرۆکەی ئەو سوێندە پیشەییەیە کە پزیشکان لە کاتی بوونیان بە پزیشک دەیخۆن.

ئەم بلیمەتە توانیی کۆمەڵێ خەڵک لە خۆی کۆ بکاتەوە و زانستەکانی پزیشکیی فێربکات، دوای ئەوەی سوێندی دان و، داوای لێیان کرد ئەوانیش خەڵکی تر فێر بکەن و سوێندیان بدەن ئەو زانستە بەباشترین شێوە بۆ خزمەتی مرۆڤ بەکار بهێنن.

ئەپۆکرات لە ساڵی ٣٧٧ی پێش زاین دوای دامەزراندنی بنەواکانی زانستی پزیشکی مرد و وڵاتی یۆنان ساڵانە لە ١٩ی ئەیلوولدا بەبۆنەی ڕۆژی ئەپۆکراتەوە ئاهەنگ دەگێڕێ و ١٩ی ئەیلوولی ساڵی ٢٠٠٣یش بە ڕۆژی جیهانیی ئەپۆکرات دانرا.

## ئێرنست هیمینگوای

حەسیب کەریم - کەرکووک



هیمینگوای لە ٢١ی تەمووزی ١٨٩٩ لە ویلایەتی ئیلینۆی لە ئەمەریکا لەدایک بووە، نووسەرێکی ئەمەریکاییە و بە گرینگترین ڕۆماننووس و چیرۆکنووسی ئەو وڵاتە دەژمێردرێ.

سەرەتا زۆر ڕەشبین بوو، بەڵام دواتر دەستی دایە پەسنی هێزی دەروونی و کارەکانی پێشانی دەدەن کە ئەم هێزە توانای ڕووبەڕووبوونەوەی هێزە سرووشتییەکانی هەیە. لە هەردوو شـەڕی جیهانیی یەکەم و دووەمدا بەشـدار بووە و ملوانکەی ئازایەتیی بەدەست هێناوە.

باوکی هیمینگوای پزیشک بووە و زۆر حەزی لە ڕاو و شکار بووە و دایکیشی ژنێکی ئاینپەروەر بووە بەڵام زۆر حەزی لە موزیک بووە. سەرەتای دەرکەوتنی هیمینگوای لە دنیای ئەدەب ساڵی ١٩٢٣ بوو کاتێ کۆمەڵە چیرۆکی «سێ چیرۆک و دە سروود»ی بڵاو کردەوە.

لـە کۆتاکانی ژیانیدا، هیمینگوای لە کووبـا دەژیا و چەند هەفتەیەک دوای ئەوەی ٦٢ ساڵی تەمەنی تەواو کرد، لە ڕۆژی ٢ی تەمووزی ١٩٦١ فیشەکێکی بە سەری خۆیەوە نـا. بەناوبانگترین کارەکانی بریتین لە: ماڵئاوایی لە چەک، زەنگ بۆ کێ لێدەدرێ، پیر و دەریا، پیاوکوژەکان، پیاوە بێژنەکان.

# شەڕی ڕاوچییان

ئا: تاتیانا عەرەفە






















ئەها، بیرۆکەیەکم هەیە..
هەندێ جار بەهۆی گرکانی ژێر زەریاوە دوورگەی نوێ پەیدا دەبن!


هەوڵ دەدەم ئامێری چرکردنەوەی کانزاکان پێشبخەم، بەڵکو هاوکارت بێ!
زۆر باشە، منیش دەزانم ماسی لە کوێ زۆرە.


ئینجا...
تەواو وەک ئەوەی پێشبینیم دەکرد، ئێرە ماسیی زۆرە و دوورگەی لێ نییە..
لێرە لە نێو ئەم ئۆقیانووسەدا...


وەک دەزانی ئێرە زۆر قووڵە..
چەند قووڵتر بێ ماسیی زۆرترە..


ڕاستە، بەڵام ئەم کارە زۆر سەختە...
ئەم ئامێرە چۆن دەکەوێتە کار؟


کانزاکانی ژێر دەریا هەڵدەمژێ و فڕێیان دەداتە سەرەوە...
کانزا، مەبەستت ئاسنە، باشە دوورگەی کانزایی شتێکی سەیر نییە؟


خەمت نەبێ، ئەو کانزایانە بە چینێکی ئەستووری لم دادەپۆشرێن...


بە خوا جوانە، ئەم داهێنانە نازدارە!
زۆر خۆشحاڵ مەبە، هێشتا ٧٥ مەتر ماوە بگەینە سەر ڕووی ئاوە..

ئۆخەی، ئاخری بوومە خاوەن دوورگەی خۆم!

مافی ڕاوەماسیشم هەیە!

ئاڵای خۆشم دادەکوتم و دەبمە ئیمپراتۆری ئەم دوورگەیە

پیرۆزە مام کەریم

(دوورگەی مام کەریم)

هەر ئێستا خاوەندارییی دوورگەکە تۆمار دەکەم...

مام کەریم خۆت ماندوو مەکە...

بۆ، مەگەر هەر شتێک لە دوورگەی مام کەریم یاسایی نییە؟

ئەم دوورگەی مام کەریمە دوورگە نییە...

ئەی چییە؟ سندووقە قومێکە بەسەر ئاوەوە...

گوێم لێ نییە، ئەمە دوورگەیەکی جێگیر نییە...

خواحافیزی لە دوورگەکەت بکە...

ئای چەند پیاوێکی خراپە...

ئەوە دوورگەکەی مام کەریم تێک دەدەن...

دوورگەکەم لەناو چوو...


کارەکەم لەناو چوو...
هەموو شتێک بە فیڕۆ چوو...


باشە، بردتەوە ئێستاش دەتەوێ کەشتییەکانم بکڕی؟
وەرە ئێرە، هەموو شتێک ئامادەیە...


بەڵام حەزم لێیە دوورگەکەم لەگەڵ خۆم ببەم، دەبێ؟
دیارە تۆ شێتی، بیبە چیی لێ دەکەی بیکە...


داوای لێبوردن دەکەم، مام کەریم، داهێنانەکەم باش نەبوو..
بەپێچەوانەوە، ئامێرەکەت باش کار دەکا، تەنیا کانزا دەردێنێ...


تکایە، ١٢ کۆپتەرم بۆ بێنە و مافی دەرهێنانی کانزای ئۆقیانووسم بۆ بکڕە...


کاتێ دوورگەکە کەوت بەلادا، زانیم پێکهاتەکەی چییە!


ئەم دوورگەیە گەورەترین پارچە زێڕە لە دنیادا و، نرخەکەی بەقەد ١٠٠ ساڵ قازانجی ڕاوەماسییە!!
تەواو

# هۆکارەکانی سستی و بێهێزی

ئازا شێرزاد - کەرکووک

زۆر هۆکار هەن کە دەبنە مایەی سستی و خاوبوونەوەی لەش و تەمبەڵی. بەشێ سەرەکیی ئەم هۆکارانە پەیوەندیی بە خۆراکەوە هەیە، نارێکیی وادەی نووستن. خەوتن بۆ ماوەی زیاتر لە ٨ سەعات لە ڕۆژێکدا. نەکردنی وەرزش.
بۆیە بۆ ڕزگاربوون لە سستی دەبێ ئەم کارانە بکرێن: خواردنی بڕی زۆر لە سەوزی و میوە. زۆر بەکارهێنانی ڕۆنی زەیتوون و خورما. خواردنەوەی ئاو. وەرزشکردن، بۆ نموونە ڕێکردن. دوورکەوتنەوە لە شەونخوونی.
هەروەها خواردن هەیە وزەی لەش زیاد دەکا و چالاکیی مرۆڤ زیاد دەکا وەک هەنگوین و خورما.
ئەگەر بەمانەش چاک نەبوویتەوە پێویستە سەردانی پزیشک بکەی چونکە لەوانەیە کێشەی تەندروستیت هەبێ.

# بۆچی باروود لە کوژاندنەوەی ئاگردا بەکاردەهێنرێ؟

شارا ئاراس - هەولێر

چەند ڕێگەیەک بۆ کوژاندنەوەی ئاگر بەکاردەهێنرێ، کە بەپێی جۆر و توندیی ئاگرەکە دەگۆڕێ. بۆ نموونە ئەگەر ئاگرەکە بچووک بوو، دەتوانرێت بە بەکارهێنانی گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن کپ بکرێتەوە، چونکە گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن نە دەسووتێ و نە یارمەتیی سووتان دەدا.
ئەگەر ئاگرەکە گەورەتر بێت ئەوا بە ئاراستەکردنی تەوژمێکی توندی ئاو دەکوژێنرێتەوە، چونکە ئەو ئاوەی بەسەر ئاگرەکەدا دەکرێ بە کاریگەریی گەرمیی ئاگرەکە دەبێتە هەڵم و بەربەستێک لەنێوان ئاگرەکە و هەوادا دروست دەکات.
بۆ زیادکردنی کاریگەریی ئاوەکە، کەمێک باروود تێکەڵ ئاوەکە دەکرێت، چونکە بەکاریگەریی بارووەدکە بەهەڵمبوونەکە خێراتر دەبێ و ڕێژەیەکی زیاتری هەڵمی ئاو بەرهەم دەهێنرێ. زووتر ئاگرەکە دەکوژێننەوە.

# لە ئێوە پرسیار لە ئێمە وەڵام

گوڵباخ - کەرکووک

هاوڕێمان شێرزاد شەریف، تەمەنی ١٧ ساڵانە، لە پۆلی پێنجەمی وێژەییە. گلەیی لە هاوڕێکانی دەکا و دەڵێ: هاوڕێکانم وێنەی نەگونجاویان لە مۆبایلەکانیان هەڵگرتووە و زۆر جار لە نێوان خۆیاندا ئەو وێنانە ئاڵوگۆڕ دەکەن. کاتێکیش دەچنە سەر ئینتەرنێت، دەچنە ناو سایدی وەهاوە، کە بە هیچ جۆرێک لەگەڵ دابونەریتی کۆمەڵی ئێمەدا ناگونجێ. چی بکەم باشە؟
«حاجیلە»:
بە شێرزادی هاوڕێمان دەڵێین: تۆ و هاوڕێکانیشت لە قۆناخێکی هەستیاری تەمەنتاندان. هیچ شتێک هێندەی وانەکان و ئامادەبوون لە پۆلەکانتان بە هاناتانەوە نایێن، بۆیە دەبێ وانەکان بخەنە پێشەنگی هەموو ئەرکەکانتان.
مۆبایل و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت بوونەتە بەشێک لە ژیانی مرۆڤی ئەم سەردەمە، ئەگەر بە شێوەیەکی گونجاو بەکاریان نەهێنین، لەجیاتیی سوود، زەرەرمان پێدەگەیەنن و تووشی سەرئێشەمان دەکەن.
ئەمانە هاوڕێتن و ڕەنگە ماوەیەکی زۆر بێت یەکتری بناسن، بۆیە پێویستە ئامۆژگارییان بکەیت، و هەوڵ بدەی دووریان بخەیتەوە لەم شتانە.
ئەگەر بە گوێتیان نەکرد، وا باشە خۆتیان لێ دووربخەیتەوە.



# چۆن قاوە بوو به خواردنەوەیەکی ناسراو

دەگێڕنەوە شوانێک هەستی بەوە کرد کە مەڕەکانی لە ناکاو چالاکییەکی نائاساییان پێشان دا، ئەویش دوای ئەوەی بەری دارێکیان خوارد.
بۆیە کاکەی شوان بڕیاری دا خۆیشی لە بەری ئەو ڕووەکە بخوا و بۆی دەرکەوت کە، چالاکی و وزەی زیاد بوون.
ئەمە هۆکاری دۆزینەوەی دەوەنی قاوە بوو و ئیتر خەڵک وردەوردە فێر بوون وەک جۆرە خواردنەوەیەک قاوە بەکار بهێنن.
دەڵێنیش سۆفییەک کاتی خۆی بەلای دەوەنێکدا تێپەڕی و دیی بەرێکی زۆری پێوەیە و کەسیش لێی ناکاتەوە. بۆیە هەندێک لە بەری ئەو ڕووەکەی خوارد و، دوای خواردنەکەی هەستی بە هێز و وزەیەکی زۆر کرد و بۆی دەرکەوت خواردنی ئەو بەرە هاوکارە بۆ شەونخوونی و خواپەرستیی زیاتر، بۆیە دەستی بە بەکارهێنانی کرد وەک خۆراک و وەک خواردنەوەش و ئامۆژگاریی موریدەکانیشی کرد بەکاری بهێنن و لە حیجاز و یەمەن و میسر بڵاویان کردەوە.

نەوزاد مەحموود - عەرەفە

# پیسکەرەکانی ژینگە

پاک عەزیز - سلێمانی

ئەم ژینگەیەی ئێمەی تێدا دەژیین بە چەندان هۆکار پیس دەبێ و ئەو پیسبوونە هەڕەشەیە بۆ داهاتووی مرۆڤ لەسەر زەوی. پیسکەرەکانی ژینگەش بە گشتی دەبنە دوو بەشەوە:
پیسکەری سروشتی، کە بریتین لە پێکهاتەکانی ژینگە خۆی، وەک مێروو و میکرۆبی زیانبەخش و ئاژەڵ و ڕووەکی زەهراوی و، با و بوومەلەرزە و دۆخەکانی کەش.
پیسکەری داهێنراو، کە جۆری دووەمی پیسکەرەکانە و، لە داهێنانی مرۆڤ و تێکنۆلۆجیان. هەروەها ئەو پیسکەرانەن کە بە هۆی پیشەسازییەوە دێنە کایەوە بەتایبەتی پیشەسازیی گەورەی وەک کارگە زەبەلاحەکان و هۆکارەکانی گواستنەوە و دووکەڵ و گازە زیانبەخشەکان و ژاوەژاو.



# یەکەمین کتێبخانەی گەڕۆک

لە ٩ی حوزەیرانی ١٩٣١ بۆ یەکەمین جار کتێبخانەیەکی گەڕۆک لە پاریس نمایش کرا. کتێبخانەکە بریتی بوو لە ئۆتومبێلێکی فەرەنسایی کە توانای بارکردنی ٢٥٠٠ کتێبی هەبوو.
دیوی دەرەوەی ئۆتومبێلەکە خانەخانە کرابوو و کتێبەکانی لەسەر دادەنرا بۆئەوەی خوێنەران بیانبینن و سەربەست بن لە هەڵبژاردن و خوێندنەوەیان.
کتێبەکان بۆ فرۆشتن نەبوو، تەنیا بۆ خواستن و خوێندنەوە بوون. ناوەوەی ئۆتومبێلەکەش هەندێک کتێبی یەدەکی تێدا پارێزرابوو، هەر کاتێک خوازەرێک داوای بکردنایە، دەیانهێنایە دەرەوە.



سیروان سەمیر - ڕەحیماوە

# بۆچی پۆلەکانی قاز لە شێوەی ٧دا دەفڕن؟

گۆران سەمیر - سەید سادق



کاتێک قازەکان بیانەوێ لە شوێنێکەوە بچنە شوێنێکی تر، بە پۆلێکی شێوە ٧ و بە خێرایی نزیکەی ٧ کیلۆمەتر و نیو لە سەعاتێکدا دەفڕن.
فرۆکەوانەکانیش لە قازەوە فێری ئەم شـێوە فڕینە بوون بۆئەوەی هەموو فرۆکەوانەکانی پشـتەوە ئەوانەی پێش خۆیان ببینن و هەمووشـیان ڕابـەری پۆلەکە ببینن، کە شارەزاترینیان بۆ ڕابەرایەتیی پۆلەکە هەڵدەبژێرن.
زانایـان ڕوونیانکردووەتـەوە، کە بۆ هەمان مەبەسـت قازەکان بەم شێوەیە دەفڕن و قازێکی نێرەی شارەزاش ڕابەرایەتییان دەکات، و شەو بێ یان ڕۆژ ڕێگە ون ناکات و دەیانگەیەنێتە شوێنی مەبەست.

# بۆچی خوێنی مێروو بێ ڕەنگە؟

مەزن عەلی - هەڵەبجە

بـە پێچەوانەی خوێنـی مرۆڤ و شـیردەرەکان، خوێنی مێروو بێ ڕەنگە. چونکـە خوێنیان خرۆکەی سووریان تێدا نییە.
هەروەها زۆربەی جۆرەکانی مێروو دایکی خۆیان نابینن، چونکە دایکەکان لە وەرزی پایزدا هێلکە و گەرا دادەنێن و دەمـرن. لە وەرزی بەهاردا هێلکەکان دەترووکێـن و مێـرووی بچووکیان لێ دەردەچـێ. ئەم مێـرووە بچووکانە هەر لـە یەکەمین ڕۆژەوە پشـت بـە خۆیان دەبەستن و کەس سەرپەرشتییان ناکا



# بۆچوونی مرۆڤ لەبارەی کوندەپەپووەوە

کەژاڵ محەمەد - کەرکووک

زۆربەی گەلانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کوندەپەپوو بە نیشانەی نەگبەتی و لێقەومان دەزانن و بینینی کوندەپەپوو یان بیستنی دەنگی وایان لێ دەکا هەست بە ڕەشبینی بکەن و ترسی لێقەومانیان لا پەیدا بێ.

خێڵەکانی ئەفریقیا پێیان وایە هەر کەسێ کوندەپەپوو ببینێ یان گوێی لە دەنگی بێ ئەوە ئەو کەسە یان دەمرێ یان تووشی نەخۆشییەکی سەخت دەبێ.

هەروەها کوندەپەپوو لای خێڵەکانی ئەمەریکا، کە بە هیندییە سوورەکان ناسراون، نیشانەیە بۆ خراپەکاری و جادووگەری.

لای ڕۆمانە کۆنەکانیش، کوندەپەپوو نیشانەی مەرگ بوو.

بە پێچەوانەی گشت ئەمانەشەوە، میللەتانی ئەورووپا کوندەپەپوو بە نیشانەی دانایی دادەنرێ.

# چۆن لە بۆنی ناخۆشی زار دوور دەبیت؟



بۆنی ناخۆشی دەم لە سۆنگەی ئالوودە بوونی زارەوە بەو بەکتریایانە ئەو بۆنە ناخۆشە دروست دەکەن یان گەدە یان هەوکردنی ڕیخۆڵە . هەروەها بەخێراییش نانخواردن هۆکارێکی ترە بۆ بۆنی ناخۆشی دەم، ئەمەش هەر زیانی جەستەیی نییە بگرە لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتیشەوە گرفتت بۆ دۆوست دەکا .جا بۆ ئەوەی هەمیشە زارت پاک و خاوێن بێت پێویستە:

- لە شەو و ڕۆژێکدا دوو جار یان سێ جار دان بە فڵچە و هەویری دانت بشۆ.
- هەرجارە دانت دەشۆی زمانت خاوێن بکەرەوە.
- هەوڵدە و ئەگەر کرا بۆنی خۆشی دەم بەکار بێنە.

میران جەمال - کانی شەیتان

# کەی ئەمەریکا ناوی دۆلاری لە دراوەکەی نا؟

شەهێن شاهین - سەید سادق

ئەنجوومەنی پیرانی ئەمەریکا لە ٢ی نیسانی ساڵی ١٧٩٢دراوی وڵاتەکەی خۆیانیان ناو نا دۆلار، کە بەرانبەر ٢٤,٧٥ گرام زێڕ و ٣٧١,٢٥ گرام زیو بوو. لە مامەڵەکانی بازاردا تاکو ساڵی ١٨٧٣ بەم شێوەیە مایەوە، بەڵام دوای ئەو ساڵە بەراوردکردنەکە تەنیا لەگەڵ زێڕدا دەکرا.

زۆر وڵاتی تر هەن کە دراوەکەیان دۆلارە و بە دۆلاری ئەو وڵاتە دەناسرێ. نرخەکەشی جیاوازە بە بەراورد لەگەڵ دۆلاری ئەمەریکایی.



# هاوڕێیانی حاجیلە



تریێ کەمال



لانیا ئاوات



مەلەک ڕەسوڵ



نادیە ڕەسوڵ



## مافەکانتان ٣

**ناز نەبەز - کەرکووک**

کۆمەڵەی گشـتیی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٩دا ڕێککەوتننامەی مافەکانی منداڵانی بڵاوکردەوە و زۆربەی وڵاتانی دنیا دانیان بە ناوەرۆکی بڕگە و مادەکانیدا ناوە و عێراق یەکێکە لەو وڵاتانە.

«حاجیلە» بۆ ئاشـناکردنی ئێوەی ئازیز بـە ناوەرۆکی ئەم ڕێککەوتننامەیە، لـە هەر ژمارەیەکدا ٣ مـادەی ئەم ڕێککەوتننامەیەتان بـۆ بڵاودەکاتەوە. تا بە ئاگا بن لە پێشـێلکردنی مافەکانتان لە سنووری خێزان و کۆمەڵگە و دەوڵەتدا.

**مادەی ٧ :**

منداڵ دوای لەدایکبوون دەبێ ناوی لێبنرێ و بۆ وەرگرتنی ڕەگەزنامە، تۆمار بکرێ.

**مادەی ٨ :**

ئەرکی سـەر شـانی دەوڵەتە ڕێز لە منداڵ بگرێ و پارێزگاریی ناو و ناسـنامە و پێوەندییەکانی ناو خێزانی منداڵ بکات. ئەگەر منداڵ لەبەر هەر هۆیەک بێت، بێبەش کرابێ لە ناسـنامە، پێویسـتە دەوڵەت هاوکاریی بکات هەتا ناسنامەکەی دەست دەکەوێتەوە.

**مادەی ٩ :**

پێویسـتە دەوڵەت مافـی ژیانی منداڵ لە ناو خێزاندا زامن بکا و بە هیچ شـێوەیەک نابێ منداڵ لە دایک و باوکی جودابکرێتەوە، مەگەر بە یاسـایەک جودای بکاتـەوە و ئەو جوداکردنەوەیەش لە بەرژەوەندیی منداڵەکەدا بێ.




# چەند ڕێنماییەک بۆ ئەوانەی زۆر لەسەر کۆمپیوتەر دەمێننەوە

**ڕێژوان شانۆ - بەکرەجۆ**

- پێویستە هەر ٢٠ خولەک جارێک، چاوت لەسەر سکرینی کۆمپیوتەرەکەت دوور بخەیتەوە و چاو لەو شتانە بکەی کە ٢٠ پێ لێتەوە دوورن، بۆ ئەوەی ئارامییەک بە چاوەکانت ببەخشیت.

٢- هەر ٢٠ خولەک ٢٠ کەڕەت بڕژۆڵەکانت بخەرە سەر یەک و بکەرەوە بۆ ئەوەی چاوت بەتەڕی بمێنێتەوە.

٣- هەر بیست خولەک دانیشتن هەڵسە و ٢٠ هەنگاو بەپێ برۆ و دواتر بگەڕێوە سەر کۆمپیوتەرەکەت، ئەمەش بۆ یارمەتیدانی سووڕاندنەوەی خوێنە لە هەموو بەشەکانی جەستەتدا.

کۆمپیوتەر

ماردین - سلێمانی

# وایەرلێس



وایەرلێس ، شێوەیەکی نوێی گواستنەوەی زانیارییە ، کە زۆربەی ئامێر و کەرستەکانی ژیانی گرتۆتەوە ، ئامێری وایرلێس شەپۆلی کارۆموگناتیسی بەکار دەهێنێت بۆ گواستنەوەی زانیارییەکان بۆ دەوروبەری خۆی ، ئەم شێوازەش لە ئینتەرنێت و بلوتوس و مۆبایل و کۆنترۆڵی ئامێرە کارەباییەکان بەکاردێن .

# بۆ پێکەنین



## پێبکەنە تا جوانتر بیت

دڵگەش دلێر - کەرکووک

مامۆستایەک لە قوتابیەکی پرسی: باوکت تەمەنی چەندە؟
قوتابی لە وەڵامدا گوتی: وەڵڵاهی نازانم بەس دەمێکە لەگەڵمانە.

باوک بە کورەکەی دەڵێت: ناوی سێ ئاژەڵم بۆ بێنەوە شیردەر بێت؟
کورەکەی لە وەڵامدا دەڵێت: سێ مانگا.



یاد کەمال - چوارچرا

دایک هاواری کردە سەر کورەکەی: بۆچی دواکەوتیت؟ پێم نەگوتی زوو بگەڕێوە لای میوە فرۆشەکە؟
کورەکـەی لـە وەڵامدا گوتـی: بەڵێ دایکە.. بەس نەتوت بەپەلە برۆ.

## خەنینەوە

ڕۆژێـک باوکێـک بـە کورەکەی دەڵێت کە چووی بۆ بازار مەعامەلە بکە کورەکەی دەڵێت باش، ڕۆژێک کورەکـە دەچێت بۆ بازار دەرواتە دوکانێکی جل و بەرگ، دەڵێت ئـەو کراسـە بەچەنـدە، خاوەن دوکانەکە دەڵێ بیست هەزار دەڵێت بە پانزە هەزار نابێت دەڵێ با، دەڵێ ئەی بە دە هەزار نابێ دەڵێ برۆ دەرەوە با دوو بۆکست لێ نەدەم کورەکە دەڵێ ئەی یەک بۆکس نابێ.

## توانجێکی جوان بۆ ئەم وێنەیە بدۆزەوە



بەهرۆز سەلام - سلێمانی

# دەبم بە مامۆستا

دیمانە: هیوای مەل - کەرکووک



ناوم (بڕوا حەسەن)ـە، خەڵکی شاری کەرکووکم و پۆلی یەکی ناوەندیم.

ئارەزووی من وەرزشە، کە زۆر حەزی لێ دەکەم، بەتایبەتی یاریی تۆپی پێ و، هاندەری یانەی بەرشەلۆنەم.

جاروبـــار کتێبی دەرەوەی پرۆگرامی قوتابخانە دەخوێنمەوە و گۆوارەکانی منداڵان ناخوێنمەوە لەبەرئەوەی گەڕەکی ئێمە کتێبفرۆشی لێ نییە تا ئەو گۆوارانەی لێ بکڕم.

لە داهاتوودا حەزم لێیە ببم بە مامۆســـتا بۆ ئەوەی بەشـــداری بکـــەم لـــە فێرکـــردن و پەروەردەکردنی منداڵانی شـــارە خۆشەویستەکەمان.



# چونکە زیرەک و گوێڕایەڵ و پاک و خاوێنم ، مامۆستاکان زۆریان خۆشدەوێم

دیمانە:شاکار ڕەسوول - کەرکووک

هاوڕێمان پێویســـت فازڵ ئەمین منداڵێکی ئێســـک سووک و پاک و خاوێنە. بە حاجیلەی گوت :

- تەمەنم ٥ ســـاڵە، ســـاڵێکی تر دەست بە خوێندن دەکەم.

ئێســـتا لە باخچەی ســـاوایانی پەپوولەم. چونکە زیرەک و گوێڕایەڵ و پاک و خاوێنم و ئامۆژگارییەکانی مامۆستایانیشم بە گرینگ دەزانم.

لە باخچە نووسینی پیتەکانی کوردی و ئینگلیزی فێربووم ،هەروەها سروود و گۆرانی وەرزشیش.

یاریکردن لە باخچەی ســـاوایان لە کۆڵان خۆشترە، چونکە منداڵی زۆری تێدایە و پاک وخاوێنیشە، مامۆستایانیش سەرپەرشتیمان دەکەن و چیرۆکی خۆش خۆشمان بۆ دەگێڕنەوە.

# نهێنییەکانی گەردوون لە چاخە بەراییەکاندا (بەشی پێنجەم)

گزنگ -کەرکووک

مرۆڤی چاخە بەراییەکانی مێژوو، بە تایبەتیش بابلی و یۆنانییەکان زۆر سەرنجی دیاردە سروشتییەکانی ئاسمانی دەوروبەری خۆیان داوە و بە پێشەنگی گەلان دەژمێردرێن لە پۆلین کردنی ئەستێرەکان و یەکەمین کەس بوونە بە ئەستێرە گەڕۆکەکانیان گوتووە، هەسارەکان. دانیشتووانی کۆنی وڵاتی میسریش وای بۆ دەچوون کە ڕووداوەکانی گەردوون بوونەتە سەرچاوەی ئیلهامی دروست کردنی ئەهرامەکان.

لە ڕاستیشدا ئەم گەلانە هیچیان لە بارەی گەردوون نەدەزانی و زۆر بیردۆزیان لەسەر بنەمای زانیاریی هەڵە دارشتووە و زانیانی دوای خۆیان ڕاستیان کردوونەتەوە.



لە چاخە بەراییەکاندا دیاردە سرووشتییەکانی ئاسمان و دەرکەوتنی کلکدار و نەیزەکەکان سەرچاوەی ترس و تۆقینی خەڵکەکە بوون و لە هەر دەرکەوتنێکدا لێکدانەوەیەکی تایبەتیان بۆ دەکرد. دەرکەوتنی کلکدارەکان هێمایەک بوو بۆ ڕوودانی کارەساتێکی گەورە و پێشهاتێکی خراپ.

بریسکانەوەی نەیزەکەکان لە ئاسمان بەوە لێکدەدرایەوە کە نیشانەیەکە بۆ مردنی کەسێکی ناودار. هەندێکیش پێیان وابوو ئەم بریسکانەوانە توورە بوونی خواوەندەکانن.






بەهرە جەبار - سلێمانی



# واڵت دیزنی

واڵتــەر ئیلیــاس ( ١٩٠١ - ١٩٦٦ ) خاوەنــی کۆمپانیای دیزنی ، تاکە کەسـێکە کە بە سـەدان ملیۆن هاوڕێی منداڵی هەبێت .

ئەم هاوڕێتیەش لە ڕێگای فیلمە کارتۆنییەکانیەوە دروسـتبوبوو ، میکی مشک و دۆناڵدی قاز دوو کاراکتەری هەرە بە ناوبانگی واڵت دیزنین .

کۆمپانیـای واڵت دیزنــی تا ئێســتا ٢٢ خەڵاتی ئۆســکاری بە دەســتهێناوە و بۆ ٣٧ جاریش بۆ هەمان خەڵات پاڵێوراوە .

واڵتەر ئیلیاس ٣ جار خەڵاتی ئۆسکاری ڕێزلێنانی وەرگرتووە .

لە ١٩٥٥ واڵتەر ئیلیـاس جیهانێکی بێ وێنەی بۆ منالان درووستکرد لە سەر سەددان دۆنم زەوی ، ناوی نا ( دیزنی لاند ) کە ساڵانە سەددان ملیۆن کەس سـەردانی دەکەن و لە دەیان وڵاتی تریش هاوشێوەی هەیە .











## تاقیگەی حاجیلە

**٨** ناز کەریم - کەرکووک



**هەنگاوی یەکەم**: دەزوویەک بێنە کە هێندەی درێژیی باڵێکت بێ. چنگاڵێک ئامادەکە و لە ناوەراستی دەزووەکەی دانێ، ئینجا چەند جارێک دەزووەکەی لێ بپێچە. هەردوو سەری دەزووەکەش لە پەنجەکانت بئاڵێنە.



**هەنگاوی دووەم**: بە هێواشی چنگاڵەکە شۆرکەوە سەر مێزەکەی بەرانبەرت، هەتا بەر مێزەکە دەکەوێ. گوێت لە زرینگانەوەیەکی نزم دەبێ.

**هەنگاوی سێیەم**: هەردوو پەنجەت بخەرە سەر گوێیەکانت و هەمان هەنگاوی پێشوو دووبارە بکەرەوە. ئەمجارە گوێت لە چی دەبێ؟

**چیت بۆ دەرکەوت؟**

کاتێک چنگاڵەکە بەر مێزەکە دەکەوێ، دەلەرێتەوە، ئەم لەرینەوەیە دەبێتە هۆی لەراندنەوەی هەوای دەوروبەری چنگاڵەکە و دەزووەکە، بۆیە گوێمان لە زرینگانەوەیەکی نزم دەبێ. بەڵام کاتێک پەنجەمان دەخەینە سەر گوێمان، دەزووەکە لە هەستەوەرەکانی بیستن نزیک دەکەینەوە، بۆیە زرینگانەوەکە بەرزتر دێتە گوێمان.





## ماڵداری

- زۆر جار کە باوک و دایکمان سێتێک هێلکە دەکرن، یەک دوو هێلکەی قرینجاوی تێدا دەردەچێ، بۆ کوڵاندنی ئەو هێلکانە دەبێ جوان لە کاغەزێکی ئەلەمنیۆم بیانپێچینەوە و بە ئاسپایی بیانخەینە ناو ئاوەکەوە، ئینجا بخرێنە سەر ئاگر.
- بۆ لابردنی لەکەی دەم و چاوت، هەندێ نیسکی هاڕڕاو لەگەڵ گوڵاو تێکەڵ بکە، ئینجا دەم و چاوتی پێ چەورکە، با گیراوەکە نیو سەعات بە دەم و چاوت بمێنێتەوە. پاشان بە ئاوی سارد بیشۆ.

ئاشتی عەبدوڵڵا - کەرکووک

## حەوت جاران بەبێ وەستان بیڵێرەوە

**کورتانی کەری کاوە کای لە ناوە**

ئەژی عوسمان - کەرکوک

## منداڵی نموونەیی

کامەران سابیر - چەمچەماڵ

زانا لای گشت هاوەڵانی قوتابخانە و مامۆستاکانی خۆشەویست بوو، هەر کاتێ مامۆستاکان باسی قوتابیی زیرەکیان بکردایە پشکی شێر لەو باسەدا بۆ زانا بوو.
کە لە زانایان پرسی، نهێنیی ئەم سەرکەوتنەت چییە؟ گوتی:
من لە ماڵێکدا دەژیم ئارامی و خۆشەویستی باڵی بەسەردا کێشاوە، هەمووان لە ماڵی ئێمەدا ڕێزی یەکتری دەگرن، باوکم بەردەوام وەڵامی پرسیارەکانم دەداتەوە و پرسیارم لێ دەکا لە قوتابخانە چی دەکەم و ئەرکەکانم جێبەجێ دەکەم یان نا.
هەموو بەیانییەک زوو لە خەو هەڵدەستین و دەموچاومان بە سابوون دەشۆین و قاوەڵتی دەکەین چونکە نانی بەیانی یارمەتیی چالاککردنی مێشکمان دەدا و، دوای ئەوە ددانەکانمان دەشۆین و بەرەو قوتابخانە دەکەوینە ڕێ.
من بەردەوام هەوڵی ئەوە دەدەم خەتی خۆم جوان و ڕێک بکەم. لە پشوودانیش قسوور ناکەم بەڵام ئەوەندە پشوو دەدەم کە پێویستە و زێدەڕۆیی لە خەو و تەمبەڵی ناکەم. یاریی خۆیشم دەکەم.
کە بۆ قوتابخانە دەچم، بەردەوام بیر لەو ئاواتانە دەکەمەوە کە دەمەوێ لە داهاتوودا پێیان بگەم ئەوەش هانم دەدا بە باشی گوێ لە مامۆستاکانم بگرم و وانەکان تێبگەم و ئەگەر تێنەگەیشتم پرسیار لە مامۆستا دەکەم.



## مامە گاگارین

حەمید خالید کەریم - کەرکووک

ناوی وی گاگاری یوورییە، خەڵکی وڵاتی ڕووسیایە، گفت شیرین و ڕوو خۆش و دڵۆڤانی منداڵانی وەکو ئێوە بوو، لە ١٢ی نیسانی ١٩٨١دا، بە گەشتیی ئاسمانی ڤینۆک و لە بنکەی ناتگتۆرەوە و بەتەنێ ڕەوانەی ئاسمان کرا، دلۆڤانان.. مامە گاگارین بۆ ماوەی ٣ سەعات، زۆر بە دڵگیریی بەدەوری زەویدا سووڕایەوە، ئەوەندەی پێنەچوو، هەواڵی گەشتەکەی، لە هەموو جیهاندا دەنگی دایەوە و خەڵکی بە پەرۆشەوە گوێبیستی هەواڵەکە بوون.
هێمن بێژی: مامۆستا گیان، بەڵێن بێت، ئێمە لە خوێندندا بەردەوام بین، تاوەکو ناوی کوردستانیش وەکو وی لە هەموو جیهاندا بڵاو بێتەوە.
خۆشی بێژی: مامۆستای دلۆڤان، پەیمان بێت داوا لە کارزانی برا گەورەکەم بکەم لە ڕووسیاوە دوو وێنەی ڕەنگاوڕەنگی، مامە گاگارینم بۆ بنێرێت و یەکێکیان پێشکەشی بەڕێزت دەکەم.



ڕۆشنا کەرکووکی
کەرکووک



جوگرافیای وڵاتان

١٧

# ئەنتیلی هۆڵەندایی





ناو: دورگەکانی ئەنتیلی هۆڵەندایی

پێگەی جوگرافیایی: ئەم دورگانە لە دوو کۆمەڵە پێکدێن و سەر بە دورگەکانی ئەنتیلی بچوکن لە ئۆقیانووسی ئەتلەسی.

رووبەر: ٩٦١ کیلۆمەتری دووجا.

ژمارەی دانیشتووان: ١٩٠ هەزار کەس.

چڕیی دانیشتووان: ٢٣٧،٥ کەس لە کیلۆمەترێکی دووجا.

پێکهاتەی ئاینی: ٨٥٪ کاتۆلیک، ٩،٥٪ پرۆتستانت، ٠،٣٪ جوولەکە، ٢،٣٪ بڕوایان بە هیچ ئاینێک نییە.

پایتەخت: ویلمستاد(١٣٥ هەزار کەسی تێدا دەژی).

گرینگترین شارەکانی: ئۆرەنجستاد، سان نیکۆلا.

جۆری حوکمرانی: هۆڵەندە داگیری کردووە و ئۆتۆنۆمیی پێداون.

دراو: فلۆراتی هۆڵەندایی.

زمان: هۆڵەندایی.

گرینگترین هەناردەکانی: بەروبوومەکانی نەوت، کەلوپەلی چنراو، توتن، ماسی.

گرینگترین هاوردەکانی: نەوت، خۆراک، رەشەوڵاخ، مادەی کیمیایی.

کات: گرینتچ — ٤.







# تۆپی باڵە

ئارەزوو نەجیب   کەرکووک



یاریی باڵە وەرزشێکە لە نێوان دوو تیپ دەکرێ، لەمبەر و ئەوبەری تۆڕێکن کە یاریگەکە دەکاتە دوو بەشەوە.

هەر تیپێک سێ جار بۆی هەیە لە یاریگەی خۆیەوە لە تۆپەکە بدا و ئەگەر تۆپەکە کەوتە سەر زەویی تیپی بەرامبەر ئەوە ئەو تیپەی تۆپەکەی تێگرتووە خاڵێک بەدەست دێنێ، هەروەها ئەگەر تیپێک هەڵە (فاوڵ)ی کرد خاڵێک بۆ تیپی بەرامبەری دەژمێرری.

هەر تیپێکی تۆپی باڵە لە ١٢ یاریزان پێکدێ کە تەنیا ٦ لەوان دادەبەزنە ناو یاریگە و ئەوانی تر یەدەگن.

ئەم یارییە لە ٩ی شوباتی ١٨٩٥ لە ئەمەریکا داهێنرا و یەکەمین یاری لە دەرەوەی ئەمەریکا ساڵی ١٩٠٠ لە کەنەدا بەڕێوە چوو. یەکەمین پاڵەوانیەتیی جیهانیی باڵەی پیاوان ساڵی ١٩٤٩ بەڕێوە چوو و هی ژنانیش ساڵی ١٩٥٢. ساڵی ١٩٦٤یش باڵە بووە یارییەکی ئۆلۆمپی.

خاڵەکانی یاریی باڵە بۆ هەر گێمێک لە ٤ گێمی یەکەم ٢٥ خاڵن و ئەگەر ئەنجامی یارییەکە ٢-٢ گێم بوو ئەوە گێمی پێنجەم بۆ بەراورد دەکرێ و لەسەر ١٥ خاڵە. بۆ بردنەوەی هەر گێمێکیش پێویستە بەلای کەمەوە جیاوازیی نێوان خاڵەکانی تیمەکان ٢ خاڵ بێ.




# یانەی هەولێر

مەغدید عەباس - گوێڕ

یانەی هەولێر لە ساڵی ١٩٦٨ لە شاری هەولێر دامەزراوە. یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٦٨ لە پاڵەوانیەتیی یانە پلە دووەکانی عێراق بەشداریی کردووە.

لە ساڵی ١٩٨٧ یانەی هەولێر گەیشتە پاڵەوانیەتیی یانە پلە یەکەکانی عێراق و، ساڵی ١٩٩٢ لە خولی نایابی عێراق یاریی کرد، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٦ پاشەکشەی کرد بۆ خولی پلە یەک و ساڵی ١٩٩٨ گەڕایەوە ڕیزی یانە پلە نایابەکان و تا ئێستا لە پلە نایاب یاری دەکا.

سێ جار لە وەرزەکانی ٢٠٠٦-٢٠٠٧ و ٢٠٠٧-٢٠٠٨ و ٢٠٠٨-٢٠٠٩ پاڵەوانی خولی پلە نایابی عێراق بووە، هەروەها لە گشت پاڵەوانیەتییەکانی جامی عێراقدا بەشدار بووە.

لەسەر ئاستی هەرێمی کوردستانیش لە خولی پلە نایاب یاری دەکا و جامی هەردوو وەرزی ٢٠٠٤-٢٠٠٥ و ٢٠٠٥-٢٠٠٦ی بردووەتەوە. لە خولی پاڵەوانانی عارەبی وەرزی ٢٠٠٦-٢٠٠٧ بەشداریی کرد و لە گەڕی یەکەمەوە دەرچوو.

# هاوڕێیانی حاجیلە خۆشحاڵن بە هاوکاریی باوک و دایکیان لە خوێندن

ڕیپۆرتاج: سارا سەلیم - کەرکووک

هاوڕێیانی حاجیلە بۆ سەرکەوتن لە وانەکانیان پێویستیان بە هاوکاریی باوک و دایک و خوشک و براکانی لە خۆیان گەورەتره. لەم ڕیپۆرتاجەدا ڕۆڵی دایک و باوکانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.



شەنگە محەمەد پۆلی چوارەمە لە قوتابخانەی هەواری تازە. باوکی مریشکفرۆشە و کەمێک خوێندەواریی هەیە، بەڵام ناتوانێ هاوکاریی بکا، بۆیە لە کاتی پێویستدا هانا بۆ خوشکە گەورەکەی دەبا و داوای هاوکاریی لێ دەکا. شەنگە دەیگوت زۆر حەز دەکەم قۆناخەکانی خوێندن ببڕم و لە دواڕۆژدا ببم بە مامۆستای زانست.



هاوڕێمان هەردی جیهاد، پۆلی چوارەمی سەرەتاییە، باوکی کرێکارە و خوێندەواریی هەیە. هەردی سوپاسی باوکی دەکا کە لە وانەکانیدا هاوکاریی دەکا و ئەو شتانەی بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لێیان تێناگا.

هەردی دوای ئەوەی وانەکانی خۆی تەواو دەکا، هاوکاریی خوشکەکەشی دەکا. حەزی لە وانەی کوردییە و هیواداره لە دواڕۆژدا ببێتە مامۆستای کوردی.



حەسەن قاسم لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییە و دەیگوت: ڕۆژانە لە ٣ سەعات زیاتر دەخوێنم، چونکە باوکم خوێندەواریی نییە و کەس لەماڵەوە هاوکاریم ناکا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر پاڤێلی برای کە لە پۆلی یەکەمی سەرەتاییە پرسیارێکی لێ بکا، هاوکاریی دەکا. حەسەن زۆر حەزی لە وانەی بیرکارییە و حەز دەکا ببێ بە ئەندازیار.



شەنگە مستەفا لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییە، باوکی ئاسنگەر بوو و پێش سێ مانگ لە ڕووداوێکی هاتوچۆدا مردووە، دایکیشی خوێندەوارییەکەی وای نییە کە بە هانایەوە بێ، بۆیە کاتێک پێویستی بە ڕوونکردنەوەیەک بێ، خوشکەکەی کە پۆلی پێنجەمی زانستییە، هاوکاریی دەکا. شەنگە زۆر حەزی لە فێربوونی زمانی ئینگلیزییە.




ئاپۆ نەوزاد لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییە، لە گوندی چیمەن، باوکی کەمئەندامی سەنگەرە و خوێندەواریی هەیە. دەتوانێ وانەی عەرەبی و کوردیی بۆ ئاسان بکاتەوە، ئەگەر شتێکم نەزانی هانا بۆ براکەم دەبەم کە هەتا دووی ناوەندیی خوێندووە. ئاپۆ دەیگوت: براکەی ترم پۆلی پێنجەمی سەرەتاییە و هاوکاریی دەکەم، حەز دەکەم ببم بە پزیشک.



سۆما ئاراس هاوڕێیەکی تری حاجیلە و لە پۆلی شەشەمی سەرەتاییە. باوکی تەکسیی هەیە و زۆر لە ماڵەوە نییە، کاتێکیش دێتەوە زۆر ماندووە، بۆیە هانا بۆ دایکی دەبا. سۆما دوای ئەوەی وانەکانی خۆی تەواو دەکا، هاوکاریی هەردوو خوشکەکەی دەکا، کە یەکێکیان پۆلی چوارەم و ئەوی تریان پۆلی یەکەمی سەرەتاییە. حەز دەکا ببێتە پارێزەر.

## باران

سۆما ماجد
پۆلی یەکەم- قوتابخانەی باباد

ئەی بارانی زستانان
سوودت هەیە بۆ هەمووان
گەنم و جۆ زوو شین دەکەیت
دەشتیش ڕەنگاوڕەنگ دەکەیت
ئاوی ڕووبار زۆر دەبێت
کەشتی پێدا ڕەت دەبێت
دۆڵ و چیا و شار و دێ
سەوز دەکەیت درەختی نوێ
دڵۆپ دڵۆپ دەباریتەوە
ئاسمان دەڕازێنیتەوە



## قوتابخانە

محەمەد ئیسماعیل - کەرکووک

قوتابخانە زۆر خۆشە
مەڵبەندی بیر و هۆشە
زۆر بە چاکی دەخوێنم
پلەی باش بەدەست دێنم
لە قوتابخانە بخوێنە
دەسکەوت بەدەست بهێنە
قوتابخانەم خۆشدەوێ
دڵ تیایدا دەسرەوێ
فێر دەبم ڕەوشتی جوان
سەربەرز دەبم لە ژیان



## کوردستان

ڕاز لەتیف - چەمچەماڵ
شەشی بنەڕەتی

کوردستانم شیرینە
شاخەکانی بەفرینە
لادێ و شار و گوندەکانی
زەوییە قەشەنگەکانی
سۆز و ڕازی هەموو دنیان
لەگەڵ هەموو شارەکان
کەرکووک و سلێمانی
گەورە و بچووکەکانی
شارە خۆشەکانی
مرۆڤە دڵسۆزەکانی
ئا لەم ژیانە خۆشە
کە چەندە بەجۆشە



## شێر و کەروێشک

هیوا عۆف - کەرکووک
یەکی ناوەندی

ڕۆژێکیان شـێرێک و کەروێشـکێک دەبێ، شێرەکە زۆر حەزی دەکرد بیخوات، ڕۆژێک هاوڕێکانی کەروێشکەکە پێیان گوت: شێرێک دەیەوێـت بتخـوات. کەروێشـکەکە هەموو ڕۆژێک بیـری دەکردەوە چی بکات، تاوەکو ڕۆژێک پیلانێکی بۆ دۆزییەوە بە هاوڕێکانی گـوت: من دەتوانـم ئەو شـێرە لەناو بەرم، کەروێشکە وریاکە ڕۆیشت بۆ لای شێرەکە و پێی گوت: من ئەوەتام وەرە بزانە دەتوانی بمگـری. شـێرەکەش تووڕە بـوو و دوای کەوت، کەروێشـکەکە گەیشتە لای دارێک و بازی دا شێرەکەش نەیتوانی بوەستێ خۆی کێشـا بە دارەکەیا و مرد، ئیتر لەو ڕۆژەوە کەروێشکەکە بە خۆشی ژیانی بردە سەر.



## دایک

سەیوان سەلاح - چەمچەماڵ

من دایکم زۆر خۆش دەوێ
ئەویش منی زۆر دەوێ
بە خەندەی لێوەکانی
بە لایلایە و گۆرانی
بە باسە خۆشەکانی
خەواندمی تا بەیانی
دایک بەسۆزە بۆمان
ڕێزی بگرن منداڵان
جەژنی جیهانی دایکان
پیرۆز بێت لە دایکەکان

## ماسی

ئاکار بەختیار-شەشەمی بنەڕەتی-هەولێر



ئەی ماسی ئازا و چالاک
پەروەردەی ناو ئاوی پاک
دنیای تۆ ڕەنگاوڕەنگە
گەرچی مات و بێ دەنگە
ئازادیت پڕ بەهایە
ژیانت لەناو ئاودایە
ئێمەی منالیش وەک تۆ
بۆ سروشت هاتووینە گۆ
چاوی لێ ناتروکێنین
گوڵی هیوا ئەڕوێنین









## تەندروستی سامانە بیپارێزە

ئەژی حوسێن - کەرکووک

تەندروستی باشترین سامانی مرۆڤە و پێشان دەیانگوت لەشساخی تاجێکە بەسەری مرۆی تەندروستەوە تەنیا ئەو کەسانە دەیبینن کە ناساخن، بۆیە دەبێ مرۆڤ تەندروستیی خۆی بپارێزێ، ئەمانەش چەند ئامۆژگارییەکن لە پێناو تەندروستییەکی باش دەیانخەینە روو:

ڕۆژانە دوو پارچە چوکلێت (کاکاو) بخۆ چونکە زانایان ئاشکرایان کردووە کە چوکلێت مرۆڤ لە کەمخوێنی دەپارێزێ و ئارامی دەبەخشێ.

بە هیچ شێوەیەک شتی قورس هەڵمەگرە بۆ ئەوەی کاریگەریی خراپی نەبێ لەسەر پشت و شێوەی ڕۆیشتن و وەستانت.

بەردەوام ئاگات لە ڕەنگی زمانت هەبێ و، چونکە ڕەنگی زمان نیشانەی هەندێ حاڵەتی تەندروستییە،بۆ نموونە ڕەنگی سپیی زمان نیشانەی لاوازیی سیستمی بەرگریی لەشە و ڕەنگی زەرد نیشانەی زۆرخۆرییە و سووربوونەوەی نووکی زمان نیشانەی ماندوویی دەروونییە.



## ماست لە شیر باشترە

ئاسیا ئەحمەد - دووبز

ژمارەیەک زانای یابانی لە زانکۆی کیۆشۆ ئەوەیان ئاشکرا کرد، کە دوای لێکۆڵینەوە بۆیان دەرکەوتووە ماست خواردنێکی نموونەییە بۆ پاراستنی تەندروستیی دەم و پووک نەک خواردنەوەی شیر.

ئەم زانایانە هۆکاری ئەمەیان بۆ ئەوە گێڕایەوە کە ماست مادەگەلێکی تێدایە کە بە ترشی ئەمینی ناسراون و پێوەندییەکی پتەویان بە ساخلەمیی پووکەوە هەیە.

پێشتر زانایان ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە بە هەمەکانی شیر بە گشتی سوودیان بۆ تەندروستی هەیە. بەڵام ئەم جارە ئەوە یەکلا کرایەوە کە ماست لە گشتیان بەسوودترە بۆ تەندروستیی دەم و ئەو کەسەی ڕۆژانە ٥٥ گرام ماست بخوا کەمتر تووشی نەخۆشیی پووک دەبن.



## ئێسکی مرۆڤ

پەروین غالب - ڕێدار

ئایا دەزانی ژمارەی ئێسکەکانی مرۆڤ لە ڕۆژی لەدایکبوونیدا ٣٥٠ ئێسکە، کە پێدەگا و تەمەنی دەگاتە ١٨ ساڵان ژمارەی ئێسکەکانی لەشی کەم دەبێتەوە و دەبێتە ٢٠٦ ئێسک؟

زانایان هۆی کەمبوونەوەی ژمارەی ئێسکەکان بەوە لێکدەدەنەوە، کە ژمارەیەک لە ئێسکەکان لە ئاستی یەکتریدا درێژ دەبنەوە و بەیەک دەگەن و دەبنە یەک پارچە. واتە لەناوناچن، بەڵکو یەکدەگرن.



پشووی حاجیلە

کوردستان محەمەد ـ ئازادی

## هەڵیبێنە

- دەگرمێنێ وەکو هەور فڕێ دەدات سپی چەور؟
- ئاگری نییە دەتسووتێنێ، گیانی نییە دەتپیشێنێ؟
- بەسەر پیرێژن بەچنگ مناڵە، بەپشتی ڕۆستەم، نەتەوەی زاڵە؟
- بەشەو وەک قیرە، تیژە وەک تەیرە، سپییە وەک شیرە؟
- بزنە گەڕێ، هەڵدەگەڕێ دادەگەڕێ، نالەوەڕێ.

## ئایا دەزانی؟

- قەڵای حەلەب گەورەترین قەڵایە لە جیهاندا.
- فەرەنسییەکان یەکەمین گەل بوون دراوی کاغەزیان بەکار هێنا.
- یەکەمین هێڵی میترۆ لە ئینگلتەرە بنیات نرا.
- سۆربۆن کۆنترین زانکۆی ئەوروپایە.
- بە بەحرێن دەگوترێ زەویی ملیۆن دارخورما.

## پەندی بەریتان

**بەم وشەگەلە ئەم پەندانەی خوارەوە تەواو بکە**

**ئاو، تیر، هەوا، مشک، دیوار.**

- ......... بێنە و دەست بشۆ.
- ئەوەی لە......... بێت جەواڵ دەدڕێ.
- بانێکە و دوو.............
- ........ لە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە.
- دار و.........گوێی هەیە.

## وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە

گڵێنە ڕەوەز - دوکان

کەی و لە کام وڵات سەرۆکی پەکەکە دەستگیر کرا.

- ۱۹۹۹ کینیا
- ۲۰۰۰ سوریا
- ۲۰۰۱ ڕووسیا

کەی پێشەوا قازی محەمەد لە سێدارە درا و لە کوێ؟

- ۱۹٤۷ مەهاباد
- ۱۹٤٦ تاران.
- ۱۹٤٥ کرماشان.

شاری وان لە چ پاژێکی کوردستاندایە؟

- باکووری کوردستان.
- ڕۆژهەڵاتی کوردستان.
- ڕۆژئاوای کوردستان.

عەبدولڕەحمان قاسملو کەی و لەکوێ تیرۆر کرا؟

- ۱۹۸۹ ڤیەننا.
- ۱۹۸۸ کوردستان.
- ۱۹۸۷ بەغدا.

پایەختی حکوومەتی میدیا کوێ بووە؟

- هەمەدان.
- قزرەباد.
- ماردین.

## بمڕەنگێنە

لەرین شەماڵ -سلێمانی



## ڕامان

شەم شوان - سلێمانی

**لەم فۆرمەدا ئەو ژمارەیە چەند کۆتایی بە زنجیرەکە دێنێ**



## قۆناخ بە قۆناخ وێنە بکێشە

بەسۆز جەبار – کەرکووک



## چاوتیژی

جوان لەم وێنەیە وردبەرەوە و بزانە وێنەی پیاوێکە بوتڵە ئاوێکی بەرزکردووەتەوە، یان بوتڵە ئاوەکە بەدەستی کەسێکی ترە و وێنەکە لە نزیکەوە گیراوە، بەڵام پیاوە دوورەکە لە ئاستی بوتڵەکەدا دەستی بەرزکردووەتەوە.



شیلان بەکر – ڕەحیماوە

## ئەم شارانە دوو ناویان هەیە

سیوە سەعید – کانی شەیتان

قەندەهار – نادر ئاباد

ئۆسلۆ – کریستیان

تاشکەند – چاچ

پەتروسبۆرگ – لینینگراد

ئەشبیلیە – سیویل

باتاویا – جەکارتا

دیمەشق – شام

بەغدا – دار ولسەلام

لاهوور – لوهاور

## ڕێکخستن

بژار سەعید – سلێمانی

ئەم پیتانە ڕێکبخە و مانای جوڵەی گوڵت بۆ دەردەچێت.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ر | ی | ل | ە | ن |

## شیکاری

تانیا وەلی - چەمچەماڵ

ناوی یەکێک لە میوە خۆشەکانە، تۆی وریا پاش شیکارکردنی دەزانی کامەیە

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١١ | = | 5 | + | 6 |
| ٢ | = | 1 | + | 1 |
| ٥ | = | 2 | - | 7 |
| ١٠ | = | 7 | + | 3 |
| ٥ | = | 2 | + | 3 |
| ١٠ | = | 6 | + | 4 |
| ٢٤ | = | 9 | - | 15 |

| | | |
|---|---|---|
| 2 | = | ە |
| 5 | = | ن |
| 11 | = | ئ |
| 6 | = | س |
| 10 | = | ا |

## بەرسڤی لەز

میران جەماڵ - کانی شەیتان

- ورچ دەبۆڵێنێ، بەراز............
- کار دەباڕێنێ، سابرین.........
- هەنگ وژەی دێ، زەردەواڵە........
- ئەسپ دەحیلێنێ، ماین...........
- مەڕ بارەی دێ، بزن...........

**باعە، گیزە، ئەمرقێنێ، مرقەی، کورکو**

## ئەمانە بزانە

هێرش قادر - خورماتوو

- یەکەمین جار تەلەفزیۆن لە وڵاتی بەریتانیا بینرا.
- سۆمەرییەکان یەکەم گەل بوونە تەپڵیان بەکار هێناوە.
- کۆنترین خەتی عەرەبی خەتی کوفییە.
- گوڵی مێخەک درێژترین تەمەنی هەیە لەنێو گوڵاندا.
- مەرجان لە دەریا دەردەهێنرێت.
- ماجەلان ساڵی ١٥٢١ فلیپینی دۆزییەوە.
- خەلافەتی عەباسی ٥٢١ ساڵی خایاند.
- لە ١٩٩٢/١٠/٤ فیدراڵی لە کوردستان ڕاگەیەنرا.

## مۆزەخانە بەناوبانگەکانی دنیا

لیمۆ لازار - ڕانیە

- لۆڤەر، سەرەتا ئەم کۆشکە دەربارەی شاکانی فەرەنسا بووە، بەڵام ئێستە سەنگینترین هونەری جیهانی لێیە.
- بریتیش مۆزیەم، لە ساڵی ١٧٥٣ لە شاری لەندەن دروست کراوە.
- مۆزەخانەی گیکتۆریا، گرانترین و بەنرخترین شتی کونینەی مێژووی تێدایە.
- مۆزەخانەی میللیی ڕۆما.
- مۆزەخانەی ئالاسکا لە ئەمەریکا.
- مۆزەخانەی بەنێوبانگی لینینگراد لە ڕووسیا.




## شرۆڤە

ناوی گەورەترین گیاندار لە شەش پیت پێکهاتووە. ئەگەر دوو پیتی یەکەمی لادەین دەبێ بە باڵدارێکی بچووک.

ڕەوا عوسمان - کەرکووک


خاوەنی ئیمتیاز

بەدران ئەحمەد حەبیب

سەرپەرشتیار

عوف عبدالرحمن

سەرنووسیار

حەمە سەعید زەنگنە

٠٧٧٠١٣١٠٥٤٢

hamatal_z@yahoo.com

جێگری سەرنووسیار

ئەبەز ڕۆستەم

بەڕێوەبەری هونەری و نەخشەسازی

پەروەر

perwer.cartoon@yahoo.com

تایپ

دلێر ڕەفیق

ناونیشان

کەرکووک - شەقامی کۆماری

تەلاری صیدلی فخری


## وەلامی ژمارەی پێشوو

ل ٣ مەتەڵ : کتێب.

ل ٣٠ ڕامان : ١١، کۆی ژمارەکانی دەرەوە دابەش ٣ بکە.

ل ٣١ ڕێکخستن، مەحوی

ل ٣٢ کام وڵاتم، کوبا

ل ٣٤ گەیاندن، دەریای مردوو

شقاتە، تەڵێک لە کۆیەکە دەخەیتە سەر ٣ دەبێت بە ٩٨-٣٣

ل ٣٦ وشەی بزر :گەڵاڕێزان

ل ٣٧ خەڵات، پڕاوکە نییە ببوورن ڕاوکەیە.

دیلان جەمال - کانی شەیتان

## گەیاندن

پاش ئەوەی ئەم هێڵانە دەگەیەنیت لات ئاشکرا دەبێت بە بەچکەی چۆلەکە دەگوترێت چی.




۱۰ جیاوازی لە نێو ئەم دوو وێنەیەدا هەیە ..... دەتوانیت دەستنیشانیان بکەیت ؟

پروشە جەبار - سلێمانی



## یاریی شقارتە

ڕۆژ دلێر - ئازادی

53+43=16

جێگۆڕکێ بە یەک تەڵە شقارتە بکە تا ئەنجامی هاوکێشەکە بکاتە شانزە .

# دووباره وێنەکە بکێشەوە



دلێر - چەمچەماڵ

## جێگۆڕکێ

هیوا حەسەن - ئازادی

جێگۆڕکێ بە دوو ژمارە بکە تا بە ستوونی و ئاسۆیی کۆی ڕیزەکان بکاتە ٢١

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 5 | 4 | 2 | 6 | 3 | 1 |
| 6 | 3 | 5 | 1 | 2 | 4 |
| 2 | 1 | 3 | 4 | 5 | 6 |
| 3 | 6 | 4 | 5 | 1 | 2 |
| 4 | 2 | 1 | 3 | 6 | 5 |
| 1 | 5 | 6 | 2 | 4 | 3 |

## سێبەر

دیاریی - کەرکووک

سێبەری پاپای ونبووە، دەتوانیت بیدۆزیتەوە ؟



## نیشانەی هەڵە یان ڕاست لەم ڕستانەی خوارەوە بدە

هەولدا ئالان - عەربەت

- سەڵاحەدینی ئەیوبی لە تکریت لەدایک بووە،
- ڕۆبن هوود لە ئینگلتەرا ژیاوە.
- پەیکەری ئازادی لە شاری نیویۆرکە.
- ئاڵای دەوڵەتی عەباسی ڕەش بوو.
- درێژی دیواری چین ٢٧٠٠ کیلۆمەترە.
- خێرایی دەنگ لە چرکەیەکدا ٣٠٠ مەترە.
- هەنگ ٥٠ چاوی هەیە.
- فیل لە ٢٠ کیلۆ زیاتر ڕۆژانە خواردن ناخوات.

# وشەی بزر

داستان - کەرکووک



| | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | | ه | ه | ه | ه | ه | | | |
| | | | ه | ه | ه | ه | ر | | | |
| | | | ك | ر | ژ | ژ | م | | | |
| | | | ا | د | ه | ی | ن | | | |
| | | | ر | ی | ن | ر | و | | | |
| ه | ه | ڵ | و | ن | د | ڵ | ه | ه | س | ت |
| ه | ه | ه | ێ | ك | ا | ر | ه | ێ | ژ | ی |
| ا | ه | | ه | ه | ن | س | ك | ه | ا | ا |
| ل | ڤ | ی | ج | ه | ێ | ق | ا | ر | ه | ر |
| ا | ن | ه | ن | ه | ۆ | ن | ر | ا | و | ه |
| | | | ی | ه | ن | ب | ه | | | |
| | | | س | ۆ | ا | ه | ڤ | | | |
| | | | ر | ز | ژ | ا | ا | | | |
| | | | ه | ا | ۆ | ن | ه | | | |
| | | | ه | ن | ه | ا | ه | | | |

**پاش ئەوەی ئەو ناوانەی لای سەرەوە ڕەش دەکەیتەوە، نێوی شارێکت بۆ دەمێنێتەوە کە کیمیابارن کرا سەر بە سلێمانییە لە حەوت پیتان پێکهاتووە.**

هەکار، هەردین، هەژەند، هۆنراوە، هەنسک، هانا، هاڤە، هێڤار، هەستیار، هەرسین، هێژا، هێکار، هامنۆ، هەژێر، هەڤی، هەڵۆ، هالان، هۆزان، هۆژان.

**پاش ئەوەی پیتەکانی ئەم ناوانەی لای خوارەوە کوێر دەکەیتەوە ناوێکت بۆ دەمێنێتەوە لە چوار پیتان پێکهاتوە و هاواتای (ئارام)ە.**

**هیوا، فەرهەنگ، کۆڤان، کۆژان، کاوە، کۆسرەت.**

| | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ه | | س | ن | و | ۆ | ا | ا | ه | ر | ك | ك |
| ه | ێ | م | ن | ی | ۆ | ا | ڤ | ه | ژ | ه | ك |
| ه | ت | و | ن | ن | ۆ | ا | ف | ه | ر | گ | ك |

## کوێرکردنەوە

شۆخان ئەحمەد-تەکیە



## هونەری دەست

شەماڵ شوکور - کەرکووک

# خەڵات

دوا دەلیقە ١٢/٢٥

کۆتایی ژیان چییە ؟

## گوتەی گەلان



عیدان جەلال - بەغدا

- گوتەی خۆش و ناسک دەرگەی پۆڵاین دەکاتەوە — تورک
- هیچ نەگوتن لە گوتەی بێ جێ چاکترە — ئینگلیز
- شەڕی بێ ئاوەز چون میوەی سەرمابردوو وایە — فەرەنسی
- خوا لەگەڵ هێزدا نییە، بەڵکو لەگەڵ ڕاستیدایە — ڕووسی
- نهێنیی خۆت بە خزمەتکارەکەشت مەڵێ — یابانی

## سۆدۆکۆ

هیوا عەلی - چەمچەماڵ

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | 6 | | | 3 |
| | 2 | 5 | 1 | 6 | |
| | | | 5 | | 2 |
| 2 | | | 4 | 1 | |
| | 3 | 1 | 6 | 2 | 5 |
| | | 2 | | | 1 |

تۆڕی سۆدۆکۆ پێکهاتووە لە ٣٦ چوارگۆشەی بچووک و ٦ لاکێشەی گەورە. ئەوەی پێویستە لێرە لەسەر تۆ چوارگۆشەکان بەژمارە (١-٦) پڕبکەیتەوە بەمەرجێک هیچ ژمارەیەک لە ڕیزی ئاسۆیی و ستوونیی لاکێشەکاندا دووبارە نەبێتەوە.

## تەواوم بکە

نەجات عەبدوڵڵا - کەرکووک



## ماتماتیک

چنار نورەدین - سەرسەنگ

بەپێی تۆماری نەخۆشخانەی شارۆچکەیەک ١٨٠ کەس بە نەخۆشــیی جۆراوجۆر و ١٣ کەســیش بە ڕووداوی هاتوچۆ مردبوون لە ساڵێکدا. بەشی لەدایکبوونی هەمان نەخۆشخانە لە هەمان ساڵدا لەداکبوونی ٢٣١ منداڵبوونی ئاســایی و ٤ حاڵەتی دووانەیان ڕاگەیاندبوو. ئایا دەزانی ژمارەی دانیشتووانی ئەو شارۆچکەیە لەو ساڵەدا چەند زیادی کردووە.

## بیرکاری

حسێن عەلی - سلێمانی

پیرەژنێکی کوێر، چوار دەنک حەبی هەیە، دووانیان سوور و دووانەکەی تر ســەوزن. دەبێ لە هەر ڕەنگێک تەنیــا حەبێک بخوا، واتا دوو دەنک یەکێ ســوور و یەکێ ســەوز. ئەگەر وا نەکا گیان لەدەست دەدا. وەک دەشزانن کوێر ڕەنگەکان جیا ناکاتەوە. باشە پیرەژنە کوێرە داماوەکە چی بکا لە کاتێکدا کەســی لا نییە و حەبەکان لە قەبارە و بۆن و تامیش هیچ جیاوازییەکیان نییە؟

## وەڵامی ژمارەی پێشوو

| | 1 | 2 | 3 | 4 | 5 | 6 | 7 | 8 | 9 | 10 | 11 |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | س | ه | ل | ا | م | | | | | | |
| 2 | ل | و | ب | ل | و | ب | | | | | |
| 3 | ی | ئ | ا | س | ا | ن | | | | | |
| 4 | م | | ب | ه | ن | | | | | | |
| 5 | ا | ش | | م | | ش | ی | ا | و | | |
| 6 | ن | | ن | ا | م | ا | ر | و | ه | ه | |
| 7 | ی | ا | و | | ا | ر | | ر | ك | ه | ب |
| 8 | | د | ك | و | ر | ی | ا | | | و | ی |
| 9 | ر | ل | | ه | | | ن | | ب | ل | ش |
| 10 | ا | ه | | ر | ی | ت | | د | ا | ی | ك |

# وشەی یەکتربڕ

ئامادەکردنی : ئارا ئاری – هەولێر




**ستوونی**

١- کاڵەک - دێوانە.
٢- پێچەوانەی ژن(پ) - تەماشاکەر(ت).
٣- بۆ - کورتکراوەی ئیسماعیل(پ) - در(پ).
٤- شارێکی سعودییە - خۆزگە.
٥- نەرمونیان - سەبر(پ).
٦- ساکار.
٧- باڵندە(ت) - گەورە.
٨- ناوی یاریزانێکی ڕەش پێستی یانەی ئینتەرمیلانە(ت).
٩- ناوێکی کوڕانەیە(پ).
١٠- وەرزێکی ساڵە.

**ئاسۆیی**

١- ناوی مانگێکی کوردییە. ٢- هەموو کەسێک هەیەتی. ٣- بینی - کانزایەکە. ٤- لووت (پ) + پیتێکە.
٥- نیوەی مەڕۆ - پیتێکە + ناوێکی کچانەی عەرەبییە(پ). ٦- شارێکی کوردستانی ڕۆژهەڵاتە(پ) - گیاندارێکی خشۆکە(پ) - نەخێر. ٧- نیشتیمان(پ). ٨- ماستی لێ دروست دەکرێت + سەوز بوو - سێ پیت لە ئەورووپی.
٩- گەمە(پ) + پیتێکە - زمان. ١٠- ناوی هونەرمەندێکی کۆچکردووی شاری سلێمانییە.

***تێبینی :*** حەوتی سەروژێری وشەکان لە نووسیندا گرفت نییە. - (پ) پێچەوانە. - (ت) تێکەڵاو.




